حکومەتی هەرێمی
کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی
چاپ و بڵاوکردنەوە.
زنجیرە (٣١٨)



# دڵۆپە

شیعر

جەبار سابیر

بەهاری ٢٠٠٥ سلێمانی



دڵۆپە
# بابەت: شیعر
# نوسەر: جەبار سابیر
# تایپ و بەرگ و مۆتیف: نوسەر
# نەخشەسازی و جیاکردنەوەی رەنگ: مەهدی ئەحمەد
# یەکەم چاپ: بەهاری ٢٠٠٥
# تیراژ: ١٠٠٠
# ژمارەی سپاردنی (١٧٣)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# بۆ دایکم



## چەند وشەیەکی پێویست

ئەم وشانەی لێرە بەدوا دەیخوێنیتەوە، بەرلەوەی شیعربن چرپەچرپی ئەو سات و سەردەمانەن کەتازە دەستم قەڵەمی دەگرت، تۆ ئازادی چی ناودەنێی‌و بەشیعری دەزانی یان شتیتر، منیش ئازادم کەبڵێم ئەم وشانە بەشێکی جیانەبووەوەن لەژیان و شیعر نوسینی من کەسەرەتای ئەم شیعرانە بۆ ساڵی (١٩٩٥) دەگەڕێتەوە. ئەو وەختانە تەنیا لەڕێگەی شیعرەوە دەمتوانی شتێك بڵێم بۆلێکدانەوەی ئەو دۆخەی تێیکەوتبووم تەنیا شیعرم بەفریادڕەس دەزانی.

بەڵام دواتر تێگەیشتم کەوەك نیچە دەڵێ: دەردی ئێمەی مرۆڤ لەوەش قوڵترە کەهەستی پێدەکەین. بۆیە منیش لەشیعر دوورکەوتمەوەو تێکەڵاوی دنیای نوسینی رەخنەیی سیاسیو رۆژنامەنوسی بووم و کانی شیعرم وشکی کرد، هەربۆیە حەزمکرد وەك نوسینەوەی یادەوەرییەکانی ئەوچەند ساڵەی تەمەن ئەم شیعرانە بخمە

بەردەست تۆی خوێنەر، تۆش گەرخۆتت تێدادۆزییەوە، من خـــۆش حاڵـــدەبم چـــونکە پێموایـــــە یـــەکیٚ: لەپایەسەرەکییەکانی تێکستێکی ئەدەبی جا شیعر بێت یاخود شتیتر چێژ وەرگرتنە لەو تێکستە، دواتر لەڕووی شـیعرییەت و رەگـەزە پێکهێنـەرەکـانی شـیعری ئـەمڕۆوە هەوڵمداوە خۆمبم و زۆرتر شیعرم نوسیبیٚ...

یاوەك شاملۆدەڵێت: شیعر منی نوسیبێتەوەو کەمتر قسەم کردبێت، لێرەوە پێموایە شیعر سەنگینترین کاری ئـــەدەبییـــەو گـــەرتوانیبێتم چـــەند شـــیعرێکی زینـــدوم پێشکەشی دنیای شیعری کوردی کردبێت ئەوابەختەوەرم.

جەبار

٢٠٠٥/٣/١٦





## شین

کەمانگ پڕا:

شەودەبێتە رۆژی رووناک،

دنیادەبێتە چراخان.

ئەوسائیتر چاوەکانت

لەبەرتریفەی مانگەشەو

شین دەنوێنن:

وەکوئاسمان.





## بەخۆمنییە

بەخۆم نییەئەگەر ئاسمان،

چەشنی چاوت شین نەبایە

هەرگیز دەستم بەرەو بەرزیی هەڵنەدەبڕی

ئەگەر پاییز چوون قژی تۆ

زەرد نەبایە، لە رۆژژمێری دڵمدا

پەڕەیخەزانم، زوو ئەدڕی..



## *من ئەڵێم*

من ئەڵێم: خەزان ئەوڕەنگە زەردەی

لەقژی زەردی ئەتۆدزیوە.

بەهاریش شێوەی گوڵاڵەسوورەی

لەخونچەی لێوی ئاڵت کڕیوە

رووبارو سامالْ هەردووك بەجوتە

شینی چاوانی تۆیان دزیوە.





## *ئەزانی*

ئەزانی

کەدەنگت جریوەی بولبولەو

چاوایشت ئاسمان و

باڵاشت ئەرخەوان.

ئەزانی

کەڕەنگت وەك گوڵەو

سیماشت پەپولەو

پرچیشت پاییزی نیشتمان.



### *چاوەکانت*

چاوەکانت:

کیشوەرێکن، دارو، بەردو، شاخیان شینە.

دەریاو، ئاسمان و خاکیشیان هەرشینە.

گەرمۆڵەت بەی:

منیش لەناویا شین دەبم.







### *پەناهەندە*

وەك چۆن:

دەریا لەماسی و

شەو ئەستێرە

خۆچاوی تۆش لەشینیدا دەوڵەمەندە

دەرپێمبدە، وەك کەسێکی پەڕاگەندە

لەنێودەریای شین ومەنگی چاوەکانتا

منیش ببمە پەناهەندە..



## *جوانی*

چەندجوانی:

بەم چاوەشینەوە.

هەردەڵێی، ئاسمانی دوای بەفربارینی و

رووباری پێش هەڵچوون و خرۆشان

بەوجلە جوانەوە:

هەردەڵێی، چناری وگوێدەگری

لەدەنگی پاساری و، لەنەغمەی بولبولان.

بەم قژە زەردەوە:

هەردەڵێی، پاییزیو جوانتری لەگوڵان.





## *تۆ*

لەتریفەی مانگەشەو،

لەساماڵێکی ساف دەچیت

تۆ لەهەورێکی غەمبارو

شنەی بای بەیانیان دەچیت

سیمات، بەرووی رووباردەچێت.

قژت هە ردەڵێی: پاییزەو

باڵات وەك باڵایشەنگەبیو

لێوەکانت هەرلەگوڵی هەنار دەچێت..



### گوڵیسوور

بەر لەوەی ببمەئاشنای تۆ

گوڵێکم بوو، گوڵێکی سوور، جوان وەکو تۆ

قەدوبالآی کەسك، کەسك

وەك چاوی تۆ

نەرموو نیان ناسك، ناسك

وەك دڵی تۆ

پەڕەکانی چوون کوڵمی تۆ

پەمەیی بوون

شۆخو شەنگ بوو

وەك سیمای تۆ.

بەڵام جوانێ کە دەرکەوتی

زەرد هەڵگەڕا وەکو زووڵفت

رەنگی پەڕیی لەشەوقی چاوەکانی تۆ..





### لەگەڵ تۆ

لەگەڵ هەموو شەپۆلێکی قژی خاوت

بەدەم شنەی سەر رێگاوە

گوڵاوێك سەرمەستم دەکات

لەگەڵ هەموو زەردەخەنەو نیگایەکتا

لێوەکانت بارانی شادی ئەڕژێنێ

دوا سەرنجی چاوی شینت

ئەمباتەوە بۆخۆشبەختی،

خەمو ئازار ماڵیدڵم جێ ئەهێڵێ..

## شیعرێکی تر

شەوانە کەتەنیا:
دەفتەرو قەڵەمێك هاوڕێمە
خەیاڵی پەرچەمو سیمات
ئەبێتە خولیامو
دێتەوەخەیاڵم ڕۆژانی ژووانی و
بارینی هەڵاڵەی پێکەنین لەگوڵی لێوانت.
بۆئەوەی تەمی ئەوخەیاڵە لەسەری خۆم دەرکەم
ئەمجارە شیعرێکی ناسکتر دەنوسم
شیعرێك بێ بەشەونم تەڕبوبێ و
شایەن بێ بەشینیی چاوانت.

## مەحاڵ

ئەگەر هاتو رووبارتوانی
لەیاداشتی ڕۆژانەیدا
ناوی ماسی ڕەش کاتەوە
یاخود مەلی نێودارستان
بەئێواران بۆهێلانەی نەڕواتەوە،
ئەوساش ڕەنگە ئەودڵەی من
لەدووری تۆ بسرەوێت و
خۆشەویستیت بەیەکجاریی لەبیری خۆی
ببـــــاتەوە.



## *پرسیار*

**تۆناپرسی؟**

**بۆگوڵاڵە ڕەنگی سوورە.**

**رووبار بۆچی چاوی شینە**

**ئەی‌نازانی:**

**کەلاس ویستی چەپکێ گوڵ بۆخەزاڵ بچنێ**

**گوڵیان بەخوێنەکەی سوورکرد**

**کەخەزاڵیش بەوەی زانی**

**هەردووچاوی خۆی دەرهێناو**

**لە نێو رووباردا نوقمی کرد..**





## *هەناسەم*

**تۆ پەڕەی ناسکی گوڵاڵەی**

**سەرچاوەی رووناکی ئەم ماڵەی**

**تۆشنەی سەحەری**

**ئەوشەوەی کەتۆدێی**

**مانگ نایا، بۆچی بێ رووی نایا.**

**ئەگەر بێ و خەرمانەی روخسارت ببینێ**

**جارێ ترهەڵنایە.**



## کەتۆ دێی

شیعر وەك پورەی هەنگ ئەوروژێ و
چوون باران دائەکاو
وەك بەفر ئەبارێ.!
ئەبارێ و ئەبارێ
تاحەوشەو سەربان وناومالّ و
بەردەرگاش وەکودڵم سپی دەبن و
ئەبێتە کرێوەو تۆفانێ، کەمرۆڤ سڕئەکات
ئەوساکە دڵی تۆش رێی نابێ بڕوات و
لەلای من هەواری هەڵئەدات..





## وێنەی تۆ

شەوانە لەدووریی بالاّی تۆ
بەهەڵمی هەناسەم
پەنجەرەی ژوورەکەم تەم دەگرێ
بەپەنجەی باریکم لەوتەمە
وێنەی تۆدەکێشم
تاسبەی رۆژ هەڵدێ
شێوەی تۆلەچاوم وندەبێ
بۆشەوی داهاتوو پەنجەرەی تاقانەم
بۆ وێنەی جوانی تۆ وەك مندالّ
دەگریاو وڕکەگرێ..





### دیدا ر

گەرویستت بچیتە دیداری مانگەشەو

مەهێڵە سەگوەڕو ئەستێرەش بزانن

ئەگینا چۆن دەبێ تۆماچی مانگ بکەی

ئەوانیش لەئێوە بڕوانن.

گەرچووشی بۆ ژووانی هەڵەکۆك

کەژاوەی هێرۆیەك بپۆشە

با بەفر هەستنەکات، نەبالێت بڕەنجێ

چونکە ئەو ڕێنادات

دڵداری لەگەڵ تۆ بێتە ژووان..





### ئەزانی

ئەزانی، لەوساوە کۆچت کردووە

من باخچەی ئارامم چڕترە

سەرم بۆ مەراق و

دەروونم بۆمەوجێ مەنگترە.

ئەزانی، لەوساوە ڕۆیشتووی

ئەلبومی خەیاڵم وێران و

هەناسەی دیدارم دوورترە

لەوساوە من مەودای بینینم تێکچووەو

کۆڵانی غەریبیم تەنگترە..



### *شەوانی بێ تۆ*

**ئەزانی، بۆچی چەم کەدەڕوا**

**هەرگیز ئاوڕ ناداتەوە**

**ئەوە ئەشکی دوودڵداری نامورادە**

**ئاوەدانیی بەجێدێڵێ.**

**ئەزانی، بۆ شەوان دنیا کش وماتە**

**ئەوەتەنیایی مانگێکە بەنامۆیی**

**پرسەبۆ خەرمانە دەگرێ..**

**ئەزانی بۆدەنگی دڵۆپی گوێسوانەت**

**نایەڵێ تۆبچیتە خەو.**

**ئەوە ئەسرینی بینایی چاوی منە**

**ئاوازی  دووریی تۆ دەچڕێ.**





### *سێ هەناسە بۆدایکم*

**دایە.. دایە:**

**ئەمشەو ترسێ لەچاومایە،**

**ئەمشەو هەرگیز خەوم نایا**

**بەدیار گلۆڵەی یادەوە**

**دەڕۆمەوە بۆودنیایە، بۆمنداڵی**

**بۆ فێربوونی فێڵو دەهۆی ئەم دنیایە.**

**بۆ زانینی ئاراستەی ئەم ڕەشەبایە.**

**دایە.. دایە:**

**نازانم بۆ خەوم نایا،**

**ئەم زامە بۆلەدڵمایە.**

**ئەی ئەم ترسە بۆچی هەردەم لەگەڵمایە..**

**دایە.. دایە:**

**من شیعرێکم بۆتۆ نوسی**

لای خۆم وابوو بێهاوتایە.

بەڵام کاتێ کەسۆزی تۆم هێنایە یاد

کورتی هێناو چی شیعرمە کڕنوشی برد

بۆو شەوگارەی کەبۆت کردم لایە.. لایە.







### ئاسۆ

دڵنیابە ڕۆژێك هەردێ،

ئێمە ببینەوە بەدۆست

وەك هەنگ وگوڵ

هەموو یەكترمان خۆشبوێ..

ئەوڕۆژە دێ باوەش بۆپەلكەزێڕنە ئاوەڵاكەین.

پەیڤینمان زمانی گوڵ بێت.

بەرەوپیری ئاشتی بڕۆین

دوژمنمان هەڕەشەو شەڕبێت..

ڕەنگە بڵێی تۆ چەند شێتی

د ڵنیام تۆش لەگەڵمان دێی.



### *ئەوەندەی تۆ*

**خۆشم ئەوێی**

**ئەوەندەی تۆ گوڵ وهەتاوت خۆشەوێ.**

**حەزت لەمنداڵ و بەفرە**

**چەندە کانی عەشقی چەم و**

**کێڵگە چاوەڕێی بارانە**

**چەندە ماسی دەریای ئەوێ و**

**هەنگ هەڵاڵەو شەو ئەستێرە**

**منیش وەها تۆم خۆشەوێ..**





### *ئەوسا*

**ئەوسا قژت وەکو بەهار گوڵی دەگرت**

**هەموو ڕۆژێ تۆدەتهێناو**

**منیش تێر، تێر بۆنم دەکرد**

**تۆ بووی تەنیا ئاواتی من**

**شەویش تۆ بووی چرای ماڵم**

**جاران دڵت دەبووە هەرمێ**

**لەوەرزی تەواو گەیینا، لەکاتی بەربوونەوەیدا**

**خۆت دەتهێناو خۆت بەغوڵامی منت دەکرد**

**بەڵام ئێستا ئەوسانییە**

**خۆشەویستیت لاولاوێکی بەربانییە.**

**نەقژت دەبێتە گوڵ و**

**نەدڵت دەبێتە هەرمێ و**

**نەلێویشت ئەولێوەیە**

**کەپێشکەشی منت دەکر د.**



## گوڵ

لەوکاتەوەی بەڵێنتدا کەبێیتەلام

لەسەر ڕەفەی مەکتەبەکەم

گوڵێکی جوانم دانابوو هەتا بیدەم

لەیەخەی جوانی وەك پەریت

زۆر چاوەڕ ێم کردی گیانە، تۆنەهاتی و

گوڵیش لەداخا هەڵوەری..





## دڵێکی ڕەق

دڵت ڕەقە:

گەروانییە، بۆچی تەنیا

هاوڕێیەتی خەزان دەکەی

دڵت ڕەقە:

گەروانییە، بۆچی وڵات

دەخەیتە جانتای دڵتەوەو لەوڕێگەیە

لەپێچێکدا فڕێی ئەدەی

چۆن زات ئەکەی..؟



### ئەمجارە

ئەگەر ئەمجارە، من گەڕامەوە
هێرۆی شیعرێکم ئەدەم لەپرچت
دوور، دوور دەست ئەگرین
لەگەڵ خەیاڵدا وەك مەلێك دەفڕین..
خۆمان ئەدەینە خۆری دەم کەل و ئاسۆی ئێوارە.
ئەگەر ئەمجارە، دەرفەت بڕەخسێ
وەکو منداڵیی دەست لە خۆڵ وەردەم.
پەیکەری باڵات لەقوڕ درووست کەم
ببمە هاوخەمی گەنجی ئەم شارە..





### گۆم

گۆمێکم:
کەتۆ دێی دەشڵەقێم
کەدەشڕۆی دەشڵەقێم.
بەم جۆرە لەنێوان هاتن وچوونتدا ناسرەوێم.
ئەمجارە کەهاتی مەچۆوە
بۆئەوەی دووبارە
نەشڵەقێم..



### بۆنی زوڵفت

کەپەپولەی وشەم فڕیی و
لەچاو ون بوو
بیٚ هیوا مام
دوای عەیامیٚ کەهاتەوە.
لەگەڵ خۆیدا خۆشەویستی و
بۆنی زوڵفی تۆی بۆهێنام..





### رووان

خەمو خەفەت:
لەڕەگەوە هەڵیانکێشام
بێڕیشە مام.
تابارانی خۆشەویستیت لێزمەی کردو
بۆسەرلەنویٚ
لەپاڵ باڵای تۆدا رووام ..

## پەیکەر



وێك دەچین:
بیرم دیَ منالَ بوین پێکەوە بۆیاریی
کەوشەنیَ دەڕۆیشتین.
هەندیَ جار: بۆ نوقلَیَ، بۆماچیَ
بەشەڕیش دەهاتین.
هەروابووین بڕوات بێت.
ئەوکاتەی نەبوو بووین، بەئەتکی کلتورێك
لەگەلَ یەك ئاشنا بووین
ئێستاکەش بۆیەکتر داماوین.
وەکویەك من وتۆ
بێدەنگین، زۆر جاریش لەشەرما
دەبینە پەیکەرێك..



## *جەژنی منداڵان*



لەم ڕۆژەدا،
لەم جەژنەدا،
لەم دەڤەری خوێن وشەڕو برسێتییە.
منداڵانی بێناونیشان، منداڵانی بێبەرگ و نان.
ئەوانەی کەهەرلەسەحەر تاخۆر ڕژان.
سۆمای چاویان دەڕژنە سەر
شۆستەی شەقامە رووتەکان.
لەم ڕۆژەدا وەك شنەی با چنگ لەسەرشان،
لێرەو لەویَ: دەبنە گەڵای دەم خەزان و
هەندیَ جاریش پێڵوی چاویان هەڵدەوەریَ
بۆلەتیَ نان.



## نامە

نامەکەت گوڵی بەهار بوو

لەم پاییزی غوربەتەدا:

وشەکانی،

پیتی تەڕوو رستەکانی

بۆڵێ ترێی چەمیلە بوون

دەنکەمرواری کەناری رووبارێکی نەشمیلە بوون

دوای خوێندنەوەی، وەك پەپولە

یەکە، یەکە هەڵفڕین و چوونە ئاسمان

بۆ کێڵگەی ئەم دڵە تەنگەم، نمە، نمە

بوونە باران..







## لەچاو تروکانێکدا

شانزەی سێ بوو، هەڵەبجەم دی

وەك مناڵێك دەم بەخەندە

دەستی عومەری گرتبوو

کۆڵی هیوای نابووە سەرشان.

شانزەی سێبوو، هەڵەبجە وەك مانگی چواردە

قۆڵ لە قۆڵدا لەگەڵ سیروان دەچوونە ژووان.

بەڵام جەخار دوای چێشتەنگاو

سیانید تەنگی پێهەڵچنین.

بەدەم تۆزی سەر ڕێگاوەخولیان دەخوارد.

بەرلەوەی لەدەرگابدەن

هەرلەوێدا گیانیان سپارد..



### *هاوڕێکەم*

ئەی هاوڕێکەم:
گەرئەتوانی لەم دەڤەری خوێن و
شەڕوبرسێتییەدا هاوکارم بی
پێڵاوەکانت سەرچاوم
گەرناتوانی بەبالاّی ئەواندا هەڵدەی
مارشەکانی شەڕ ڕەوانکەی
جانتاکەت بدە بەشانتاو
لەم وڵاتە سەفەربکە..







### *کەسێك نەبوو*

کەسێك نەبوو:
تەنیا کەسێك،
کەهاواری بگاتە خواو
سووك پێی بڵێ:
تۆئێمەت لەبۆچی خوڵقان
بۆگەمەی خۆت
بۆمەینەتی
بۆخزمەتی دەوڵەمەندان..
یان بۆ ژیان.؟؟



## ؟

خواش ئێمەی خەڵەتان.

خواش ئێمەی خۆشنەویست

خواش زوڵمی لێکردین

هەروەکو رانەمەڕ.

کەئێمەی بەخشییە لەشکری

گەلەگورگ..





## بۆ تۆ

وام پێخۆشە زووپێت بگەم.

کە پێم گەیشتی دەست لەگەردن

چەشنی لاولاو ئاوێتەت بم

بەڵام لەیلا نازانم بۆ؟

قەدەر ئارەزووی پێناکات

بۆ ساتێکیش بگەم بە تۆ

کەپێم دەگەی:

هەرچی وشەی شیعرم هەیە بیرم دەچێ و

زەردە خەنەت قەت نایەڵێ:

ڕازی دڵمت بۆ بەیان کەم.

وام لێدە کات لە پێکێکدا

هەڵت بدەم..



## *سەوزایی خەیاڵ*

**بەرلەنوست،:**

**بەنێو سەوزایی خەیاڵداوەڕێ کەوتم**

**ئێستە بەهار سەراپامی داپۆشیوە.**

**بۆنی بارانی بەهارو، بۆنی گوڵچاڕ**

**مەستیان کردم..**

**تا گەیشتمە نەرمەڵانی سەرسنگی تۆو،**

**هەوراز ڕۆیشتم:**

**تادەمم نا بەپلوسکی دوولێوتەوەو**

**تێر هەناسەتم هەڵمژی.**

**چاوم بڕییە شینایی چاوەکانی تۆو**

**هەربەو خەیاڵەوە نوستم..**





## *دووتروسکە خەیاڵ*

**خەیاڵ دێت دەمبات**

**بەم نیوە شەوە تاریك وتەنیا،**

**دەڕۆین بەرەو خوار**

**بۆسەر نواڵەی، کەناری ڕووبار**

**دەیکەین بەشایی، بۆدڵنەوایی**

**خەم هەڵدەڕێژین، لەسەر فەرشی خوا**

**خەفەت دەنێژین:**

**دەم بەپێکەنین، پڕشیلەی ئەوین.**

**تاوێ ناسرەوین، دڵ دەبزوێنین.**

**لەشکری خەفەت، هەڵدەوەشێنین..**

**ئەوین دێت دەمبات**

**بەپەلە دەڕۆین، هەروەك شنەی با،**

**بۆقەراغی شار، بۆئەو جێگایەی**

مانگ لێی دێتە خوار.
هەرسێك پێكەوە، بەچەپڵەڕێزان
گۆرانی و هاوار، تابەرە بەیان
لەگەڵ كازیوە دێینەوە ناوشار
ئەوین جێم دێڵێ و
مانگ دەچێتەوە سەفەری ئاسمان.
خۆشم بەرەو ماڵ بەگرفتاریی و
دڵی پڕ ئازار..







## بابڕۆین

حەزئەكەی بابڕۆین:
تائەگەین بەئاسۆ
جەنگەڵی ئەم عەشقە جێبێڵین.
مەملەكەت بسپێرین بەخێڵی بایەقوش.
گیانەكەم بابڕۆین نەریتی ئەم هۆزە
سەرچڵ وبێفەڕە، هەردەڵێی منالە
بابڕۆین سەفەركەین ژین لێرە مەحاڵە.
دەبینی بالأمان چوو دڵمان كون دەبێ
هەردەڵێی قامیشی شمشاڵە..



## لەگەڵ با

پەنجەم لەپەنجەی با ئاڵاند
گەیاندمیە ماڵی هەور
قۆڵم بەقۆڵی هەورا کرد،
بردمی بۆ سەفەری ئاسمان.
ڕۆیشتین، رویشتین
تاگەیشتینە کێڵگەی هەژاران.
ئەوسا هەور ژانی گرت و
لەوێ ئیتر وردە، وردە
بووینە باران..





## پەنجەکانم

پەنجەکانم دابەباران
کەهاتنەوە هیواو خەندەیان بۆهێنام
پەنجەکانم دابەهەتاو
کەهاتنەوە، ئەوینی خۆریان بۆهێنام
کاتێکیش کەپەنجەکانم دابە تۆ
ئەی نەو نەمام لەگەڵ خۆیان
گوڵێکی سووریان
بۆهێنام..

*وەنەوشە*



وەنەوشە گیان،

بالە مەرزی ئەوئایینە گوزەربکەین

بالە باخچەی ئەو جەلادە سەفەربکەین.

کەڕێنادات من وتۆ یەکمان خۆشبویَ

بالەویستگەی پەڵەهەوریَ

لەنگەر بگرین، هەتاباران

چی ئارەقەی لەشمان هەیە بیشواتەوە.

بالەئاونگ تێر بڕوانین.

بۆخەیاڵمان بباتەوە

هەربۆئەوەی دڵمان چیتر

شەرابی تالَ نەخواتەوە..



*پێشبینی*



بەرەو رووم هات:

مناڵێك بوو روح سوك دلَ پاك

لەگەڵی دووام:

ڕەوتی لاری ئەوشەقامەی پێنیشاندام

رۆی تێپەڕی، وەلیَ ئەفسوس

کاتیَ لەوسەر گەڕایەوە

عومری ساوای وەنەوشەیی

وەکو بەفر توایەوە

قژی چڵکن ریشی سپی، کەمنی دی

رەنگی هەمووگیانی پەڕی.



## ترس

ئەترسم ئەمشەو:

ڕەشەبای دووریت چڵی تەنیاییم

بشکێنێتەوە

ئەستێرەی بەختم درەنگ هەڵبێت و

بۆبەدبەختی من زووبکوژێتەوە.

ئەترسم ئەمشەو:

خوانەکات دووربێ، گوێی شەیتان کەڕبێ

گەردوون لەجێگەی خۆی ڕابووەستێ و

چیتر خولنەخواو، خۆریش بەدەوری

ئەم زەمینەدا نەسووڕێتەوە.

دنیا هەرشەوبێ و

بۆهەتائەبەد، ڕۆژ نەبێتەوە.





## ئەلبوم

ئەلبومەکەت هەڵدایەوە:

یەکەم وێنەی منت دڕاند

دووەم وێنەی خۆتت دڕاند

سێهەم وێنەی هەردووکمانت لەتوکوتکرد

هەتا دوایی بێزار بویت و

دیسانەوە، کەرتی هەموو وێنەکانت

یەکە، یەکە لێکدایەوە..



## گلەیی

ئەی خودا تۆ:

بۆچی ئێمەت هێنایە بوون.

ئەم ئازارەت بۆ توشکردین

بۆئەم ژینەت پێبەخشین تۆ.

هەردەڵێی ریخۆڵە کوێرەین،

دەبێ رۆژێ لەناوبرێین

بۆچی هێشتت سەرەتا بێین ئەی سیاتەخت.

گەرئەتوانی بمان ژێنە، گەرناتوانی

بمانبەوە بۆ خەزنەی خۆت.





## ئومێد

گەلاوەری:

گولْ پەڕە، پەڕە هەڵوەری

مانگ تریفەی کوژایەوە.

زەمەن کڕبوو

لەدواییدا سالْ وەرسوڕا

لەهەگبەیدا، بەهارێکی

کەسکتری هێنایەوە..



### *لەنێوانی من وتۆدا*

لەنێوانی من و تۆدا
کزەیەکی زۆرسارد هەیە،
مینا بەیانیانی زستان
بۆیە نەتۆ بەمن دەگەیت و
نەمن بەتۆ..
لەنێوانی تۆو منیش دا
عەشقێکی زۆر گەرم هەیە.
گەرم وەکو چلەی هاوین.
بەتاووتین
بۆیە هەرگیز نەمن تاوێك بێ تۆ دەژیم
نەتۆش بێ من!





### *شنەی با*

کەشنەی با
لەگەڵ پرچت یاری دەکات.
برژانگی چاو لەناو دڵم
زەخمێکی تر کاری دەکات
لێوی تەڕو کوڵمی ئاڵت
چاوی ڕەشی ئێجگار گەشت
بۆسەر لەنوێ فۆڕمی شیعرم
دیاری دەکات.!



### جگە لەتۆ

ئەی خەزاڵی شیعری تازەم
گەربۆ باڵای،
چەشنی ئاڵای
شەنگت نەبێ،
گەردی عومرم بە(با)نادەم
گەربۆ چاوی،
تەلیسماوی،
رەشت نەبێ.
دەست لەیەخەی خەم بەرنادەم.
تاتۆ خەزاڵ بیت من لاسم
جگە لەتۆ هیچ کەسێکی تر ناناسم..





### ماچ

هەناری خەندەیەك
لەلێوت هەڵڕژا
پەپولەی خەیاڵێ لەچاوت هەڵفڕی
پەپولەم گرتەوە و هەنارم تێر تێرخوارد،
دوای رۆیشتن: هەر وەك یادێ
جێ ماچی دوولێوت لەسەر
رووم بەجێمــــا.!





### تەنیایی من

ئەڵێم، بەڵکو ئەمشەو دەنگیٚ..
لەلای تۆوە بگات بەمن،
دەنگیٚ چەشنی تیشکی خۆربیٚ
ماڵی چۆڵم بکات رۆشن
چیبکەم ئەمشەو کە تەنیایی
وابڕستی لێبڕیوم
دەڵێی لەشکری دوژمنە
واچوار دەوری لێتەنیوم.
زۆر دەگەڕێم بۆهاودەمیٚ.
کەمیٚ لەحاڵم بپرسیٚ؟
گویٚ شلکات بۆناڵەی شەوم
لەتەنیایی من نەترسیٚ..





### کەئەدوێی

کەئەدوێی
هەرئەڵێی پەپولەی بەچرپەی
کەئەدوێی
رووباری و ئەخرۆشێی
ئەڕژێیتە ناخمەوە
تۆشنەی، چەند جوان و
لەسەر خۆی.
کەئەدوێی هەرئەڵێی شەونمی و
لەزاری گوڵ دەڕژێی.
هەردەڵێی هاواری و
بۆ ناخی من دەخشێی.!

### لەتۆم نەبیست



بەپانو پۆڕی تەمەنم بۆتۆ گەڕام.
بەدرێژایی هەزاران شەو
هێندەی ئاوی گشت دەریاکان
فرمێسکم رشت
هەربۆ دووری تۆ دەگریام.
ئەم جیهانەم هەمووی تەیکرد
فرسەخ، بەفرسەخ، بۆتگەڕام.
تاپێت گەیشتم،
بەڵام جەخار، سرتەیەکم لەتۆ نەبیست
تەنیا هەر ئەوەندەم دەویست،
بانگم بکەی بە (خۆشەویست)
ئەفسوس، ئەفسوس: ئێستاو، ئەوساش
لەتۆم نەبیست، ئەی خۆشەویست.!!



### سێ نەفرەت



١

لەپەنجەرەکەوە روانیم،
کۆترێك بەسەر دارتێلەکەوە
نوێژی بۆ ئاشتی دەکردو..
هەر لە ژێر دارتێلەکەدا،
مرۆڤێك سێرەی تفەنگی
لەکۆترەکە گرتۆتەوە..
نەفرەت لەمرۆڤ.!

٢

پەپولەیەك:
لەگوێ ئاوێ،
رۆژنامەی بەرائەتی
بۆتەیرەکان ئەخوێندەوە،

بۆقێك لەبۆسەدابوو بۆی
نەفرەت لە بۆق..!

٣

گوڵێك شانازی
بەخۆوە دەكرد..
كەوا بەیەخەی كچێكی جوانەوەیە
كەچی باڕەش هەڵی وەراند
نەفرەت لە "با"



دڵی بەرد

تۆ دەتەوێ
دڵداریی لەگەڵ بەرد بكەی
كچێ ئاخر بەرد دڵی كوا..!
بەرد.. دڵداریی
كوادەزانێ ..
دڵی رەقە:
وەك دڵی "با"



## *تێنەگەیشتن*

**لەگێژاوا.. لەدایك بووین،**

**بۆیە ئاوا..**

**هەردەم دەگرین،**

**نەمانزانی بۆچی دەژین.**

**تێشنەگەیشتین بۆچی**

**دەمرین..!**





## *شەونم*

**لەگەرد و گوڵی بەیانا**

**مانگ و هەتاو، لەگوڵجاڕی بەهارێکدا،**

**ژووانیان هەبوو..**

**دوای راماووسین، لێو ماچکردن.**

**وەك یادگارێ، ئەوەی جێما**

**بۆ هەموو عاشقانی وەك من..!**

**تەنیا فرمێسکی فیراق بوو:**

**لەسەر پەڕەی هەموو گوڵێك،**

**بوو بەشەونم..**



### *هەڵکۆڵین*

**هەڵم کۆڵە**

**چەند دەتوانی هەڵم کۆڵە..**

**گەر بەپەنجەی خۆت ناتوانی،**

**بەم پەنجانە هەڵم کۆڵە.!**

**تابزانی چی خانەیەك لەگیانمایە،**

**تەنیا ناوو شێوەی جوانی**

**تۆی تێدایە..!**





### *کچێك وەك گوڵی سوور*

**چوون گوڵی سوور**

**لەسەر رۆخی چەمی کەفچڕ**

**هەڵکورمابوو**

**هەر دەگریاو**

**هەر دەکڕوزاو**

**دڵ بۆ کوڵمی خوێن تێزاوی**

**هەر دەسووتا**

**خەم وەك هەتاوێك**

**بردبووی**

**چونکە ئیتر**

**تاقە گوڵی**

**دیاری دەستی دڵدارەکەی**

**ئاوی ئەو چەمە**

**بردبووی.!**

# هەندێك دڵۆپە شیعری بێناونیشان



(      )

لەسەرگۆنات جێگەماچێ

لەسەرلێوت بەڵێنی ژووانێکی سبەی ....

لەسەرگۆناو لێوەکانت

رازێکی لەمێژین هەیە،

رازێك دەڵێ:

هەنگی فڕیوی سەرزارت، بەرزەفڕە،

لەهەنگی شانەی دڵ ناچێو

ژووانی سبەی

لەگەڵ مرۆڤێکی ترە..!





(      )

ئەمەوێ ماڵێکم هەبێت

فەرشەکانی تێکڕا گوڵ و

دیواریشی لەدرەخت و

پەنجەرەکانی باران و

پەردەکانی لەپروشەو

ئاسمانیشی لەبەفربێ.!

تاگەر خۆشەویستێکم هات:

گوڵ و درەخت مەستی بکەن و

پروشەو بەفروبارانیش

لەئاستیدا بتوێنەوە،

ئەمن ماڵێکی وام دەوێت..





( )

خوداكان هەموويان مردن،

مرۆڤەكان هەموويان مردن

خۆشەويستى مرد... و

مرۆڤايەتيش تۆخۆش

كەچى جەخار ئێمەهەرماين.!

خوداكان..

هەموويان درۆن... قسەى پوچن.

مرۆڤايەتى و ئەوين

جگە لەدرۆ شتێكى ترنييە،

درەنگ زانيمان ئاشنا

هۆى بەدبەختى ئێمە راستييە.!





( )

رەنگت: رەنگى پەلكەگيايە،

روومەتت دەڵێى: شەونمەو

هەناسەشت سروەى بايە.

بالأت لاولاوى گولْ مۆرە،

سۆماى چاوت تيشكى خۆرە

قژت وەك شەوگارى ڕەشە

سيمات، مينا گوڵى گەشە.

هێماى دڵێكى بێ غەشە.

پەيڤەكانت چوون پەشمەكن:

شيرين...شيرين.!

لەناخمدا دەتوێنەوە،

نيگاكانت شەماڵێكن

هەوێنى عەشق و ئەوين



زەردەخەنەی ژیانێکی زۆر
ڕەنگینن..!



(      )



شەو رادەشکێ:
بەسەرپشتی خەیاڵەوە
ئارام، ئارام دەکەومەڕێ
دەست بەباڵی فریشتەکانەوە دەگرم
تانەکەوم،
تاون نەبم
تالەخۆما نغرۆنەبم،
دەیاندوێنم... ئەستێرەکان
چەشنی پۆلێ ماسیگرەی زۆر
برسی و هار..!
دێنەخوارێ
چاودادەگرن،
وەك کچێکی شلکەنەمام
باخی سینە دەترازێنن
دوو کۆتری هەڵکورماوی ناوهێلانە

لەخەودەکەن...

هەر بەڕێوەین:

هەتا ئێستاش دانەنیشتوین...

هەر ب

ە

پ

ێ

و

ە

ی

ن

تادەگەینە... نزیك سەوزەڵانی ئەوین

توتڕکی شۆخ کەسەرگەرمی سەمای شەوە

بانگمان دەکات بۆکەرنەڤاڵی گوڵجاڕو قامیشەڵان.

تانیوە شەو چاومان پڕە لەگۆرانی و

لێومان... لێوان لێوە لەماچ......



سەرمان تەژی لەخەیاڵی ئەویندارى و

دەستمان کەیلە لەشیلەی ژووان..

کەدێمەوە:

لەئازای جەستەم دەڕوانم

پەنجەکانی هەردوو دەستم

لەباخی سینەی جێماوە،

تومەس لەگەرمەی دەستبازی و

مەم گوشینا..!

کۆتری سینەی دەنوکیان

لەپەنجەم داوە..!

خانەقین ٢٠٠٣/١٠/٢٩



( )

لەگەڵ زەردەی دەم ئاوابوونی خۆری ئێوارە

ئەو وەختانەی خۆری دڵڕەق

بۆسەر جێگەی خەوی دەچێ.!

هەر ئەووەختە لەگوڵجاڕی باخچەی نزیك

ماڵەکەمان

سەدان دڵۆپەشەونمی

ناسك چوون گۆنای شەرمنی

نەشمیلە جوانەکەی هاوڕێم..!

سەرپەڕەی هەموو گوڵەکان دەکەنەماڵ

ئای چەند جوانە:

لەپایانی هەموو، هەموو ئەوشەوانە

ئەو شەوە بێئەستێرەو، بێڕوناکی و

ئەوشەوە بێتروسکانە.!

چ نابێ تۆش.. هەربەخەیاڵ





بۆخۆت تەنیا... سەرپەڕەی گوڵ

بکەی بەماڵ،

بەڕاستی نا.. هەربەخەیاڵ....

خانەقین ٢٠٠٣/١٠/٣١

(          )



**ئەو وەختەی تۆ:**

**رەنگی پەشیمانی دەگری**

**من عاتیفەم لێدەچۆڕێ**

**ئەو دەمانەی تۆ لەکەلاوەکانی پەشیمانیدا**

**گێژە، گێژ بەدەم هەنسکی فیراقەوە،**

**بۆنەوایەك دەگەڕێیت..**

**من لەمێژە لەماڵی شەونمدا**

**شەرابێکی ئاڵ دەنۆشم،**

**شەرابێك سوور، سوور**

**وەك ئەوخوێنـــەی لـــەدەمی برینـــەکانی عیـــشقەوە دەچۆڕێ..!**

**ئەی یار... ئەی بێدەروازەترین**

**قەڵاکانی بەختەوەری**

**تۆسەرکردەی ئەو سوپایەی**



**جگەلە تاعون... شتێکی تری پێنییە**

**بۆمەملەکەتی ئەوین...**

**تۆسەرمەدیترین ئافاتێکی**

**کەدات لەگوڵ.. خاکی دەکەیتە بەیار**

**من عەیامێکە دەزانم:**

**لەکوچەکانی دڵی تۆدا**

**وەتاغێك نەماوە**

**عەشق سەرخەوێکی ساویلکانەی**

**لێبشکێنێ..!**

**من دەزانم: ئەوپەتایەی پەخشی دەکەی**

**چاوی کزی گوڵەکان**

**توانای خوێندنەوەیانی نییە.!**

**ئەی دۆست واباشە لەم دووڕیانەدا**

**یەکتری جێبهێڵین..**

٢٠٠٣/١١/١١



(        )

مینا ناڵە،ناڵی گەڵایەك

لەدەست ( با )

چوون هاواری كلووەبەفرێ

لەكاتێكدا باران بەلایدا دەڕوات و

دەیكاتەوە بەئاو..

چەشنی شیوەنی شمشاڵێك

كەبەدوولێوی شوانەوە

ئاوازی نیگەرانی دەچڕێ.

بێزارم، بێزار

وەك بێزاری (تەشی) بەدەست

تەشی ڕێسێكی نەزانەوە،

چەشنی ماسی لەچەشەی قولاپ و

دەنوكی ماسیگرە..



خودایە... بێزارم

هێندەی بێزاری و دۆشداماوی تۆ

بەدەست پێغەمبەرە

خۆپەرستەكانتەوە،

هەر وەكو بێزاری تۆش

لەشەڕەكانی ئاهورامەزداو ئەهریمەن

فریشتەو شەیتان

جوولەكەو ئیسلام....

هەروەك بێزاری گوڵی قەیسی

لەدەستی (با) ی دارئاوس

چەشنی بێزاری نێرگزێك كەهەڵیدەكێشن و

دەیفرۆشنە بازرگانێكی دەبەنگ.

بێزارم وەك ئەوفلتەری جگەرەیەی

لەدوانەفەسدا دەخرێتە ژێر

پاژنەی پێڵاوەوە.

چەشنی دڵۆپە ئاوێك لەبێزاری خۆمدا

بۆقڵشێکی زەوی دەگەڕێم..

تاونبم و ڕۆبچمە خوار..

کەبێزار دەبم

وەك ڕەشماڵێك بەدەست

لوورەی ڕەشەباوە گێژدەخۆم،

بۆمانایەك دەگەڕێم

سوکناییم پێبدات...!

٢٠٠٣/١٢/٢٣



## ڕۆژێك



ڕۆژێك ئێمەدەمرین

ڕۆژێك ئێوەش دەمرن

ڕۆژێك هەموومان دەمرین..

وەك چۆن ئاو پاییزان وشکەبێ و

بەهاران دەژێتەوە.!

وەك چۆن درەخت گەڵای دەوەرێ و

سەرلەنوێ سەوز دەبێتەوە.

وەك چۆن هەرچی گیانلەبەرە دەمرن و

دەڕۆن و دیسان بەجۆرو شێوەیتر

دێنەوە..!

ئێمەیش ڕۆژێکدێت بمرین و لەدوای ئێمەش

دیسان ئەوان بێنەوە..

٢٠٠٣/٦



## ئێمەهیچمان نەکرد

بەهار ڕۆیی:

چ بێباك تێپەڕی و ئێمە

نەمانوێرا گوڵێك پێشکەشی یەکترکەین

نەمانتوانی مشتێ سەوزایی

بکەینە گلێنەمانەوە.

پێمان نەکرا قومێك لەژیان هەڵمژین.

بەهار ڕۆیی

بۆمان نەکرا تێر، تێر عاشقبین،

نەمان توانی عەشق بەڕوتی ببینین،

ئاه.... چ بەشەرێکی شەرمن بووین

ماچێکی یەکترمان نەکرد

بەهار ڕۆیی، کەچی ئێمە هیچمان نەکرد.

٢٠٠٣/٥







## زریان

ئەو (با) بوو

بایەکی دەنگ گڕو بەلوورە،

کەدەهات گڤەی لەپێش خۆیەوەو

هەموو شت زەلیلی دەستی بوو

شاخ و ئاو

دارو بەرد

تاشەوێکیان دەمەوبەیان

ئەو وەختانەی با بۆئێرە

گوڕی دەخوارد،

شاخ بڕیاریدا نەجوڵێ

ئاو بڕیاریدا نەشڵەقێ

دار بڕیاریدا نەشڵەژێ

بەرد بڕیاریدا بچەقێ

(با) هەرچەندێ خۆی ڕاوەشاند

ئەهات ئەچوو بەبێوچان

ئەوەندە هات، ئەوەندە چوو

تاوای لێهات بووبە زریان..

٢٠٠١/٤



# ئەمساڵیش رۆی



ئەمساڵیش تەمەن

چەشنی ئاوی چەم

سەرەو خوار رۆیی

بەدەگمەن شادیو لێوان لێو لەخەم،

ئێمەیش گەورەبووین

هەروەك دوونەمام،

گەڵای تەمەنی جوانیمان وەری

نازانم بۆمام.!

پێی ناوێ خەفەت بۆچوونی بخۆی

هاتووشی وایە

ژیان بێنرخە، ژیان وەك پوشی

دەم زریان وایە.!

ساڵێ تریش دێ:

ژمارە یەک بێ، یادووبێ ، یاسێ

بێسوودە، بێسوود

چۆن تیر لەدەمی کەوان دەردەچێ

ئاوا دەردەچێ.

دەڵێی: هاتووە ئاگر بڕفێنێ

ئومێدی عیشق و زیندەگانیمان

لەدەست دەربێنێ...

ساڵیش هەردەڕواو تۆش جێدەمێنی

میراتی ئەویش ڕۆژ ژمێرێکە دەبێ بیدڕێنی..

سەری ساڵی ٢٠٠٣



## دووئیرۆتیکا لەئاو



دەریا کیژێکی ئەسمەری، قەیرەکچی کەڵەگەتە

لەسەرتەنیشت پاڵکەوتووە.

کراسێکی ئاودامانی شینی کاڵی لەبەردایە،

تەمەڵ، دەغەڵ، هەمیشە هەرخەواڵووە.

پاوپوز گۆشتن: کەمەرگۆزەیی و پتەوە،

شەپۆلی ئەو لەشە سفتەی هەمیشە

لەسەرپاشووە.

چاوی سەرنج نینۆکی پەنجەی نەدیوە:

چ قوورەتە گۆنای بمژی،

دەست بۆمەمکی تورتی بەری.

چەند بانگی کەی بێخەبەرە

گەربەڵێنی ژووانت باتێ

سووربزانە دواسەفەرە.!

کانی کچێکی لەباری سوورو سپی
نەونەمامە،
بەژن کورتەو مەم شەمامە،
چاوی چوون چاوی قرژاڵە
گەورەنابێ و
هەرمناڵە....
سروشتی واهەڵکەوتووە:
هەردەم بێدار
لەسەرپشت لێی پاڵکەوتووە.
ئەو رووت و قووت ڕاهاتووە،
حەزی لەسایەی توترك و



دەست لەملانی شۆڕەبییە.!
زۆر سەهەندو چاولەدەرە،
ئەو هەمیشە ستیانەکەی لەسەربەردی قەراغی خۆی
هەڵخستووە.....!
جوان، جوان دیارە:
چوون پەڵەیەك ڕێحانەی ڕەش
دووبن باڵ و سێگۆشەکەی خوارکەمەری،
دەریا بەخیلی پێدەبات
رووبار دەیەوێ وشکی کات.
کەچی ئەویش، هەرشنە، شن تاقامەتی کورتتر ببێ
هەردەلالەو، ئەولەشە شووشو ناسکەی
رووتتردەبێ و
روونتردەبێ..!
٩/ ٢٠٠٢





## وێنەیەك لەسەر پەڕەی گیا

بەهاربوو هاتی:
لەگەڵ خۆت خەندەو
هیوات هێنابوو...
هاتی و لەماڵی کەسکی
گزنگدا،
لەژێرساباتی تەڕی وەنەوشە
خامۆش وەستابووین
دەم پڕلەخەندە
بەرامبەر باڵای وێنەی
فریشتە..
نەبی نابم،
هەشبم دڵتەنگ
تۆلەرەی شادی و



منیش ئاوی مەنگ،
ئەوسا مناڵ بووین وەك لەبیریشتە
زۆرجار بەپەلە
بەنمەی ئاونگ
لەسەرپەڕەی گیا دروستمان دەکرد
وێنەی فریشتە.!
ئێستاش وەك ئەوسا
جار، جار بۆیادێ
کاغەز دەهێنم بۆ وێنەکێشان،
بەڵام سەد جەخار
چەندێ هەوڵبەم
وەك وێنەی ئەوسای سەرپەڕەی گیاکەم
هەربۆدەرناچێ....
٢٠٠٢/١٠

## لەوەی گەڕێ



تەمەن نیوەی ڕۆی
بەڵام کەهاتی:
ئەوەی کەچووبوو
بۆت هێنامەوە، خۆزگە چەندساڵێ
پێشتردەهاتی.
ئێستاش چ نەبووە..
چش لەوەی کەچوو
مادام من تۆم هەی
لەوەی گەڕێ چوو...
لەنوێ تێهەڵدەچینەوە
خۆمان دەدەینەبەر باران
تاشەلاڵ بوون
تەواو تەڕبوون



ئەوسائیتر
بۆهەوێنی عەشقێکیتر
باوەشێ گوڵ دەچنینەوە
پەڕەپەڕە گوڵێکیان هەڵدەوەرێنین
بەختی یەکتر دەگرینەوە،
خۆدنیا بەوەی ناڕوخێ
ئێمەش نەبین ئەوخەمە کەسێك
هەردەیخوا..
باسەردەمێ بێخەم بژین
دوور لەتاڵی و سوێری دنیا،
لەوەی گەڕێ سبەی چییە، یاچیدەبێ.!
وەرەئەمرۆ... بۆیەك بژین
ئەو لەسەرئێمە ناوەستێ.!
چۆنی بوێ..... هەروادەبێ...!

٢٠٠٢/١٠

# تامەزرۆی بارانی دەنگتم



من هێندەی خاکێکی تیفەرۆ

تامەزرۆی بارانی دەنگتم

کەی زەنگێ لێبەیت و

بڕژێیتە ناخمەوە

وەك چەمێ هاژەکەی ئەم خەمە ڕامالّی

ئەوەندەی تابلۆیەك پێویستم

بەڕەنگی چاوتە.

ئەوەندەی گوڵدانێ

پێویستم بەگوڵی روومەت و پڕۆپۆی

پەرچەمی خاوتە.

بارتەقای شیعرێکی زۆر کورت و ناسکیش

پێویستم بەپیت و هاڕمۆنیای یەك یەکەی

چەن پیتی ناوتە



من هیندەی خاکێکی تیفەرۆ

تامەزرۆی بارانی دەنگتم

ئەو زەنگە لێبەدەی....

چەخماخەو بروسکەی

بارانی بەهاربەو

لەم دەشتە رەقەن و دێبەرەی

دڵی من

زنەیەك بژێنە.!

وەك گڵکۆی سەربازی نادیار

چاوەڕێی سێبەری باڵاتم

زوو وەرەو لەسەر ئەم گۆڕەی دڵ

گوڵی خۆت بڕوێنە.!

ئەوەندە شەکەت و هیلاکم

وەك بڵێی

ئاوێكی تینووبم

دەخێرا بڕژێرە گیانمەوە

تینوومە، تینوومە، تینوو.......

دەهەڵكەو وەك شنە

بڕژێرە ناخمەوە

وەك تەزووی زیندەگی تۆ وەرە ناومەوە

وەك رەنگێ بڕژێرە چاومەوە

من هیندەی خاكێكی تیفەرۆ

تامەزرۆی بارانی دەنگتم

ئەو زەنگە لێبە دەی.....

٢٠٠٤/٣/٣١



## وەك ژینێ كەئیتر

پێشكەشەبەهاوڕێم بەختیارحەسەن

دواوێردی زمانی پەپولەو

دوانەشئەی قەرسیلی گەنم و

چریكەی هاواری بناری

تۆ...... هاژەی باڨلی بێخاڵ و

تۆ...... نسێی ئێوارەی سەركانی و

تۆ...... هەرخۆت ئایەتی رژاوی

ئومێدو

سووراوی سەرلێوی ژیانی

تۆ...... هەرخۆت... گزنگی

ئەو وەختەی پێكەنین

دەڕژێتە ناوسینەی ئەوین و

چریكەی سترانی هەست ونەست

پردەبێت لەسەما.

**ئەو وەختەی کە وشەی سەرزارم باڵدەگرێ و**

**وەك پۆلێ بازۆڕی هەرێزی زمانم**

**جێدێلێ..**

**تۆ لێرەی ئەودەمەی**

**کەخونچە دەچێتە کەوشەنی ژانەوەو**

**قریشکە لەدەمی گوڵەباخ هەڵدەسێ.**

**تۆ..... لێرەی ئەوکاتەی کەزنەی دەم بەهار**

**چاوانی دەتەقێ وفوارەی ئاوی روون**

**هەڵدەسێ.**

**من لەوێم، لەوجێیەی ئەوەڵجار**

**لەبەردەم بینایی کەسکتا سوژدەم برد**

**لەوێشم لەوشوێنەی یەکەمجار**

**لەحەنای قژی وەك پاییزتا**

**وەك بەفری بەهارێ توامەوە.**

**تائێستاش لەوشوێنەم کەپەنجەی دوودەستت**



**وەك ماسی پێوەبووی قولاپێ**

**لەحەوزی دەستما تاسان و**

**دوایںجار بوون بەگوڵ....**

**هەرلەوێم، لەوجێیەی**

**قەستم بوو باوەشت بگرم و**

**تارۆژی قیامەت هەرڕاکەین.**

**ئاخ.. ئیتر زەمانی وڕێنەو بزرکان تێپەڕی و**

**تۆلەوێ هەرخۆتی و**

**من لێرەم لەنێوان مەراق وخەفەت و**

**ئازارا.**

**من لێرەم وەك ئاوێ ڕژاوم**

**وەك درەخت لەڕیشەم براوم**

**وەك زامێ کەئیترچابوونی بۆنییەو**

**وەك ژینێ کەئیترمردنی بۆنییەو**

**وەك ژینێ کەئیتر..**

**شەوی حەڤدەلەسەرهەژدەی هەشتی دووهەزاروچوارکاژێریازدەی شەو**



## گوڵی شیلان

ناوی شیلان
لەناوی تۆ
ڕەنگی پاییز
لەڕەنگی تۆ وەرگیرا..
ناسکی ئەو
لەدڵی تۆ
قامەتی ئەو
لەبەژنی تۆ وەرگیرا..

٢٠٠٤/١١







ڕۆژێك ئێمه دەمرین خودا دماهی دێت
سەرکەوە سەردواین پلەی ئەو ئۆخژنەو
بەرەو دەروازەی ئومێد ڕاکە..
تالەحزەیەك ژیان لەگیانتاماوە.. سارای تەنیایی
تەیکەو .... لەپێدەشتی کاکی، بەکاکی هیواکانتا.
تەخت دانیشەو
تاهێزو گوڕت تیایە بەهەردوو دەست بەسەری خۆتی کێشەو
هاواربکە: خودای گەورە بمانبەخشە

ڕۆژێك ئێمە دەمرین.. فریاناکەوین پەڕەی
وەریوی گوڵەکان و
باڵی وەریوی پەپولەکان بچنینەوە.
فریاناکەوین وەك تۆبەکارێکی بەئیمان
لەناخی دڵەوەتۆپەرستی بکەین
خودایە بەگەورەیی خۆت بمانبەخشە
وەك: کچەکانی هاوڕێمان تۆشمان
چەندجارێك فریوداو
تۆبەمان شکاند!!!
خودایە لێمان خۆشبە، دوای دەیان ساڵ
عەشق
نەمان توانی ماچی لێوی مەعشوقەکانمان
بدزین.
خودایە تۆبە.. هەزاران جار تۆبە
ئێمەفریای هیچ نەکەوتین.. چش
لەپێچاوپێچەکان نەمانتوانی
راستە رێگەکانی ژیان تاقیکەینەوە.
خودایە دوای عەیامێك دەردەسەری



هێشتا لەگڕوگاڵی ئومێدو ئەلفوبێکانی ژیان
شتێکمان حاسڵ نەکرد؟
خودایە جگە لەوانەی (هیچ) لەهەموو
وانەکاندا بەسەرا کەوتین
خودایە تۆزقاڵێك تروسکایی لەبنی
هەمبانەکەدا نەماوە
بەدیار چیەوە دانیشین؟ سۆفی گۆشەی کام
خانەقابین
بەرِیشی مەردانەی کێ قەسەم بخۆین
کەخدری زیندە هەرنەهات و
ئاوی زیندەگانی بوو بەهەڵم
خودایە، هارەی وەرینی گەڵاکانی مەراق
وڕوکاسی کردین، ڕووڵەکوێ کەین
بەم جەستە شەکەتەوە،
کام تولەڕێ بگرین..
خودایە هیدایەتمان بە کەهەر دەمرین ئیتر
ژیان بۆ.؟

کەهەر دەمرین با.. بەر لەمردن نەختێك

لەدەنکە تووی وەریوی سەرشەقامەکان

بخۆین، ئەو دەنکە تووانەی ڕێبواران

بێدەربەست پانی دەکەنەوە؟

خودایە چش لەمردن

بۆچی خوێنت لەدەمارەکانماندا گەڕاند

دەلێگەڕێ بافریای کۆکردنەوەی پارچە

شکاوەکانی دڵمان کەوین

خودایە بۆچی ئەو جەستە ناسکەت داوەتە

مێشوولەو دڵێکی ڕەق

*حیکمەت چیەلەڕەقی جەستەمان وناسکی دڵمان*

خودایە ئێمە ڕۆژێك دەمرین نەخوێن

لەگیانماندا دەگەڕێ و نەفرمێسکێك دەمێنێ

بۆ وەرین.

ڕۆژێك ئێمە دەمرین خودایە تۆش دماهیت

دێت

خودایە: تۆبە هەزارجار

تۆبە..





دایکم تەنیاترین مەخلوق

دایکم بەپانوو پۆڕی تەمەنی

خەریکە بەتاڵە سپیەکانی قژی

ڕەشایی ڕۆژەکانی داپۆشێ و

بەبیری تۆڕئاسای تەونی قاڵی زەمان بچنێ

و،

لەبەرپێی پێغەمبەرەکانی خوادا ڕایخات

ئەو بەتەمایە، تائەبەد سوپاسی خوابکات

بۆئەو هەموو بەدبەختی و

کڵۆڵیەی بەباڵایدا بڕیوە..!

ئەو لەخەیاڵەکانی ئاوڕ وونترو

بێگرێ و گۆڵ ترە لەشیعرەکانی نالی..

دایکم چەشنی تریفەی مانگەشەو عەیارانە،

دەچێتە بەردەم ئاوێنەکانی گومان.

بەشانەی توترکێ پرچی هیواکانی شانە

ئەکات!

خەمەکانی ئاڵترە لەدەنکی توترك و

ئومێدەکانی سەوزترە، لەقامەتی فەریکە نۆك

خۆزگەکانی زەردترە.. لەچاوی مناڵێکی

ئالودە بەزەردوویی.

ئەوئیقتراحاتی بۆژیان نیەو

دەڵێ ژیان.. وەك ترۆزییەکی تاڵ وایە

گەرخواردت دەبێ تفی کەیتەوە

ئەو بەرنامەی بۆژیان نیەو دەڵێ: تێپەڕینی

شەو و ڕۆژ شتێ نیە، تەنیا ئێمەین.

چاومان دائەخەین و خێرا ئەیکەینەوە؟!

دایکم، ئەوەتەی فێری حونجەکردنی

خەمەکانی بەرد بووە،

لەخەمەکانی خۆی ناگات و دڵی بۆبەرد

ئەسوتێ.

ئەو هەمیشە خەفەت بۆ ڕقی بەرد ئەخوات و



دەڵێ: خۆزگە بەرد نەرم بوایە

تاگەر بەر سەری مناڵێك کەوت نەشکێ و

گەرمناڵێك ویستی بەدارلاستیك لەچۆلەکەی

گرێ، نەی پێکێ

دایکم، سەراسیمەترین مەخلوقە لەبەرامبەر

گوڵکردنی قۆخ و ڕەنگی

پەمەیی گوڵی

ئەرخەوان،

ئەو سەیری ڕۆژژمێر ناکات و

کەچی بەتاڵەکانی قژی. لەڕۆژژمێرەکەی من

باشتر ڕۆژەکان ئەژمێرێ و

ڕۆژنامە ناخوێنێتەوە، کەچی بەڕێ ڕێی

تەوێڵی

هەواڵە ناخۆشەکانی دنیا دەزانێ و

سەیری تیڤی ناکات و کەچی پێش من..

بەنوکتەکانی گورجوگۆڵ پێدەکەنێ.

دایکم، قامەتی وەك بەژنی دارەکانی

سەرچنار

دەیان خەفەت پاڵی پێوەداوەو
سەری چەشنی گوڵەباخەکانی باخی گشتی
سەدان خونچەی تیاهەڵوەریوە.
دایکم، سادەترین مەخلوقە
چەشنی سادەیی ئاو
دەستەکانی هەربۆئەوە دروست کراون
ڕووەو ئاسمان هەڵبیبڕێ و سوپاسی خوای
پێبکات..
دایکم، دوورترین مەخلوقە لەخوداو



لەپێغەمبەرەکانی خودا
زێباترین خەم دایکم، تەنیاترین مەخلوق.
تەنیاترین مەخلوق.





پیاوە ناشیرنەکان

جەنگەکان بۆئێوە، بەڵام لێگرێن

بۆنی گوڵەکان بۆئێمەبێ.

جەنگەڵەکان بۆئێوە، بەڵام واز

لەنسێی شۆڕەبییەکان بێنن بۆئێمە.

هەرچی جوانی دنیایە بۆئێوە، بەڵام توخوا

لەودزێویەی خۆتان بێبەشمان کەن.

هێی.. پیاوەناشیرنکان

پیاوەدزێوەکان

ناشیرنیەکانی ئێوە، جوانیەکانیئێمەی

سواخ دا.

بێعەقڵیەکانی ئێوە، حیکمەتەکانی ئێمەی

لەگۆڕنا

ئاخر بێمانايیە تەمەنی ئێمە لەنوکی



خەنجەرەکانی ئێوەوە درێژبێتەوە؟!

چەند گوناحین لەبەردەم کەوتنە خوارەوەی

هەرمێیەکدا

لەبەردەم زەردبوونی، سێوێکدا!

تێناگەین لەحیکمەتی قڵیشانی دەنکە

بستەیەك.

ئێمەچەند بێدەسەڵاتین لەبەردەم مەیینی

پێکەنین و

قەڵبەزەو فوارەی گریاندا!

چەند بێدەربەستین لەئاست بەهەدەرچوونی

عومری منالیمان ئێمە نەمانتوانی بەڕوتی

بچینە بەرباران

ناوێرین لەڕووناکیدا لەخۆمان بڕوانین.

چەند بێئابڕووین لەبەردەم شوراکانی

ڕاستگۆییدا

چەند بێمەعناین، لەئاستانەی عەشقدا

ئای.. ئێمە عەیامێکە لەدرۆ زیاتر....

ڕاستیمان
نەدرکاندووە.
ئێمە ترسنۆکین، زۆرترسنۆك
لەشەقەی باڵی کۆترەکان، لەهاڕەی گەڵاکان
لەئانی هەڵوەرینا..!
ئێمە ناتوانین.. یان ناوێرین
بەدیارکرانەوەی خونچەیەکەوە
کروشکەکەین.
چاومان بەرایی نایە لەکلویەك بەفر بڕوانین.
ئای چەند بێحیکمەتین تێناگەین
جوانی پەپولە لەوەدایە زۆرکەم دەژی
جوانی گوڵ سەبەبی زووژاکانیەتی.
تۆبڕوانە چەند بچوکین لەئاستانەی هەڵفڕینا.
چەندەگەورەین لەدەڤەری شەڕ و شۆڕو
بێئەوینا.
سوچی ئێمەنییە هاوڕێ..! ئەوان بوون



پیاوەناشیرنەکان بەپێوە میزیان کرد
بەئێستاو ئاییندەمانا
هێی پیاوە دزێوەکان.!
ئەرێ ئێوەلەکەیەوە لەئاوێنەتان ڕوانیوە.
لەکەیەوە ڕوخساری خۆتان نەدیوە...
تازەئێوە بەچی دەبن بەشنەی "با"
ئێوە گوڵتان دروێنەکرد!
تازەئێوەنابنە درەخت..
دارستانتان گرتێبەردا!
بەچی دەبن بەجۆگەو چەم..
ئێوە هەورتان نەزۆك کرد!
ئێوە تازە نابنە ڕووبار..
ماسیتان ژەهرخوارد کرد!
هاوار: حیکایەتەکانی ئێمە!

**سەدانی وەك ئێوەی تیایە.**

**پەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارمان**

**وێنە گورگ ئاسای ئێوەی گەلێك تیایە..!**

**دەبێ عومرێکی تر بەدیار توانەوەی**

**مۆمەکانەوە دانیشین؟**

**عەیامێکی تر بەڕیشی بۆزەوە گوڵەوەچنی**

**نائومێدی کەین.**

**هاوار.. هاوار.. سرودەکانی ئێمە هەرکەوتن**

**و داتەپینە!**

***بەئاستەمیش هەڵنافڕین.. هەڵفڕینمان هەر***

***کولانەوەی برینە..!***

***ئەم شیعرە کاریگەری شیعرێکی ئەحمەدی**

**شاملۆی شاعیری هاوچەرخی فارسی**

**بەسەرەوەیە.**

**٢٠٠٣/٩/١**



## بەرهەمە چاپکراوەکانی نوسەر:

# پروشە شیعری منداڵان . ١٩٩٨
# کەڤاڵێ وەنەوشە شیعری منداڵان .٢٠٠٠
# گۆرانییەکی قژ زەرد شیعری گۆرانی . ٢٠٠٢
# ئەومناڵەی دوێنێ گریا ستونی رۆژنامەوانی . ٢٠٠٤
# چرپە چرپی ئەودیو ئازادییەکانی ژن وتار لەمەڕ پرسی ژن . ٢٠٠٤
# بەهەشتێ لەکاغەز ستونی رۆژنامە نوسی . ٢٠٠٥